ع: ظَهر، مَتن، خَلف، اَزر، صُلب، صَلا، قَرا، وَراء.

**پشت**

ك: چینه، باوەپشت، پشته.[(خزم لە باوکەوە.)]

ف: پشت، خویشاوند. (خویشاوندان پدری)

ع: صُلب، عَصبَة، عاقِلَة، عَشیرَة، اَقارِب، طائِفَة، قَبیلَة، حَيّ.

**پشت**

ك: پەنا، پشتیوان.[یاوەر، پاڵپشت]

ف: پشت، پناه، کاروگر، اَندَخس، پشتیبان.

ع: مَلجَا، مَلاذ، مُتَّکَا، ظَهیر، مُعین.

**پشت!**

ك: ختە!، خت!، فس![(فەرمانە بۆ دەرکردنی پشیلە.)]

ف: پشت!، خت!، ختە! (امر بە رفتن گربە است.)

ع: غَس!

**پشتاو**

ك: دەوانچە.[دەمانچە]

ف: تَپانچە، تَوانچە.

ع: طَبَنجَة.

وێنە←شەشناگر

**پشتاوپشت**

ك: پشتەودوا.[پێچەوانە رۆیشتن]

ف: پَس‌پَس.

ع: قَهقَرَة، قَهقَري، تَقَهقُر.

**پشت ئەسپ**

[ك: پشتی ھەسپ]

ف: بَرخَش، پَرخَش، فَرخَش.

ع: ظَهر الْفَرَس، مَتنُ الْفَرَس.

**پشت‌خورێن**

ك: چێوپشت.[دارێك كە پشتی پێ دەخورێنن.]

ف: پُشت‌خاره، پشت‌خار، کبیجه، سَرخاره.

ع: مِحَكّ، مِحَكَّة.

**پشتدار**

ك: کوڵوفت، قوڵ، قەڵەو، مەغزدار.[پتەو، ئەستوور (وەك: قاڵی پشتدار.)]

ف: ستَبر، سطَبر، استَبر، گُنده، کُلُفت، پُشت‌دار. (قالی مثلاً.)

ع: ضَخیم، ثَخین، غَلیظ.

**پشتدار**

ك: مایەدار.[خەست (وەك: چای مایەدار.)]

ف: پشت دار، مایه دار. رنگ دار. (چایی مثلاً.)

ع: غَلیظ.

**پشتدار**

ك: باراندار.[خاوەن کەسوکار.]

ف: پشت‌دار، خویشاونددار، پُرخویشاوند.

ع: ذُو قَبیلَة، کَثیرُ الْقَبائِل، کَثیر الْاَقارِب.

**پشت‌دەری**

[ك: نەڵقەرێزی دەرگا.]

ف: چِفت، بَندینه.

ع: زِلاج، مِزلاج. (سَقاطَة)

وێنە←نەڵقەرێژ

**پشت‌رێش**

ك: پشتەرێش، ناوکەرێش، پشتزەخم.[(وڵاخێك كە بە زەبری بار- بۆ نموونە - پشتی بریندار بووبێت.)]

ف: فگال، فگار، اَفگال، اَوگار، ریش پُشت، پُشت‌ریش. (حیوانی کە از صدمەی بار مثلاً پشتش زخم شده باشد.)

ع: صَرِد. مکتوف.

**پشتسەر**

ك: پشت‌مل.[پشتەمل، پشت گەردن]

ف: پُشت‌سر، پُشت گَردَن، پَس گَردَن.

ع: قَفا، قَذال، خَلف الرَّأس، وراءَ الراس، عَقبَ الراس.

**پشتسەر**

ك: پشتەسەر، پەیسەر، پێوار، پشتەملێ.[پاشملە]
ف: پُشت سَر.
ع: غیاب، غَیبَة، خَلف، وَراءَ الظَّهر.
**پشتسەریەك**
ك: پەساپەس، پەسای‌پەس، پەی‌سەریەك، شوێن‌یەك، یەکەشوێن یەك. [یەك لە دوای یەك]
ف: پَی‌درپَی، پشت‌سرهم، پَیوَسته.
ع: تَتابُع، تَعاقُب، تَلاحُق، تَوالي، تَواتُر، وَلاء، تَتري، تَساتُل، انسِتال. مُتَتابِعاً، مُتَعاقِباً، مُتَلاحِقاً، مُتَوالِياً، مُتَساتِلاً، مُنسَتِلا، مُتَواتِراً، تَتالياً.
**پشتکوم**
ك: کومێ، کوم، قوز.[پشت‌کوور]
ف: کوز، کوژ، قوز، کُنج، زونگ، زونگل، زونزک.
ع: اَحنی، اَحدَب، اَدفأ، اَمتَأ، اَجنَف، اَقطَن، اَحنَب، مُحَنَّب.
**پشتکرتن**
ك: دووپشتەکی.[ئەو سوارەی کەسێکی تر لە پشت خۆیەوە سوار دەکات.)]
ف: پشت گرفتن، دوپُشتی. (سواری که دیگری را پشت خود بگیرد.)
ع: اِکتِفال، اِحتِقاب، اِرتِداف، اِزدِمال.
**پشتکورد**
[ك: (داری پشتەوەی تەون.)]
ف: پشت‌گرد. (چوب پشت تَون را می‌گویند.)
وێنە←گورد
**پشت کوێچکە**
[ك: ئەودیوی گوێ.]
ف: پُشت گوش.
ع: خَلف الأُذُن، وَراءَ الأُذُن.
**پشتکوێچکەخستن**
[ك: گوێ پێنەدان.]
ف: پشت گوش انداختن.
ع: تَظهیر، تَولِیَة، جَعلُ (الشَّيء) ظِهرِیاً، جَعلَهُ وَراءَ الظَّهر. جَعلَهُ دَبرَ الأُذُنَین.
**پشتکین**
ك: دواگین، دوایین، قرە.[ئاخرین، پاشین]
ف: پَسین.
ع: اَخلَف، آخَر، اَخیر.
**پشت مازە**
ك: مازە.[مازی، بڕبڕەی پشت. هەروەها: گۆشتی ئەملاولای بڕبڕەی پشت.]
ف: مازه، مازَن، مازو، فُراک.
ع: حَصیر، صُلب، قَرا، وراء الصُّلب.
**پشت ماڵ**
ك: پەستور.[خەڵوەتی]
ف: پستو.
ع: خادعَة.
**پشت ماڵە**
ك: ... هارسا، هارساماڵ.[(هاوسێی پشتەوە.)]
ف: هوبه. همسایه. (همسایه‌ای که در پشت خانه واقع باشد.)
ع: ظِهرَة، ظَهیرَة. جار. (ظَهیرَةُ البَیت)
**پشت مل**
ك: بۆقەتە، بۆقەتەی مل، پشتسەر.[پشتەمل، پشت گەردن]
ف: پس گردن، پُشت گردن، پُشت سر.
ع: قَفا، قَفاء، قَفَن، قافِیَة، مَقَذّ، قَذال، کاهِل.
**پشتوپەنا**
ك: پەنا، پشتیوان، کۆمەك.[یاوەر]
ف: پُشت‌وپناه، پشتیبان، کاروگَر، اَندخَس، کُمَک، دَستگیر، پشتیوان.
ع: ظِهرَة، ظَهیر، مُعین، سَنَد، عَون، رِدء، حامي، مُؤیِّد.
**پشتووری**

ك: پستەسووری، پشتیوانی، کۆمەکی، پشتگەرمی. [پشتبەستن. هاریکاری]

ف: پُشت گرمی، پُشتیبانی، پُشتیوانی، دل‌گرمی، کمک.

ع: اطمینان، استِظهار، اتِّکاء، اتِّکال. رِدء، مُظاهَرَة، مُعاوَنَة.

**پشته**

ك: پشت، چینە، قنگەزە.[خزم و خویش، هۆز]

ف: پُشت، خویشاوند، خانواده.

ع: صُلب، عَشیرَة، عَصَبَة، جَیل، قَوم، قَبیلَة، اَقارِب، حَيّ.

**پشته**

[(ك: توێکڵ فڕێدانی ئاوڵە.)]

ف: پُشته. (پوست انداختن آبله.)

ع: اِنقِشار.

**پشته**

[(ك: مەودای نێوانی دوو کوڵەکەی بیر[1].)]

ف: پُشته. (فاصله‌ی بین دو تیر چاه.)

ع: ...

**پشتەپا←پاچەقولێ**

**پشتەڕێشە**

[ك: برینی پشتی ولاخ بە هۆی بارەوە.)]

ف: فگاری، فگالی، اَفگاری، اَوگاری، پُشت‌ریشه. (زخم پشت الاغ از اثر بار.)

ع: صَرَد، جُزَل، دَبَرَة. (فَهُوَ صَرِدٌ)

**پشتەسەر**

ك: پێوار، پشتەملێ. خوسپ.[پاشملە]

ف: پشت‌سر. پَرتاد، دشت‌یاد، زشت‌یاد.

ع: غِیاب، غَیبَة، قُفُوّ. غِیبَة، اِغتِیاب، نَمیمة، هَمز، وِشایَة.

**پشتەملێ**

[ك: ئیشت: زللەی پشتەمل.]

ف: پس گردنی، پشت گردنی.

ع: لَكّ، قَفد.

**پشتەملێ**

ك: پشتەسەر، پێوار.[پاشملە]

ف: پُشت‌سر.

ع: غِیاب، غَیبَة، قُفُوّ، تَقافِي.

**پشتەودوا**

ك: پشتاوپشت.[پێچەوانە ڕۆیشتن. هەروەها: ئەو کەسەی پشتاوپشت دەڕوات.]

ف: پس‌پس.

ع: قَهقَرة، قَهقَری، تَقَهقُر. مُتَقَهقِر.

**پشتەوسوور**

ك: پشتسوور، پشتگەرم.[پشتبەستوو، دلگەرم]

ف: پشت‌گرم، امیدوار، دل‌گرم.

ع: مُتَّكي، مُستَظهِر، مُتَّكِل.

**پشتەوقەفا**

ك: پشتەودوا، بەپشتاکەفتن، بەپشتاخەفتن، بەپشتەوکەفتن. [لەسەر پشت ڕاکشان.]

ف: آستان، از پشت خوابیدن.

ع: تَسَلُّق، اِستِلقاء، اِسلِنطاع، اِسلِنطاح، اِنسِداح، اِنزِراق.

**پشتەوکەفتن**

ك: ئەنعاکردن. لەگوپ دان.[حاشا کردن]

ف: کیبیدن، مَنبلیدن، اَرَندیدن، سرباز زدن.

ع: اِنکار، اِباء، جَحد، جُحود، تَأبّي، تَحاشِي، تَبَرُّء.

**پشتهەلکردن**

ك: ڕووهەڵچەرخانن. ڕوین.[ڕووەرگێڕان، ڕۆشتن]

ف پشت کردن، روبرگرداندن. رفتن.

ع: اِشاحَة، تَصَعُّر، تَوَلّي، اِدبار، اِستِدبار، تَولِیَة.

---

١- لە فەرهەنگی عەمیدا «پشتە» ئاوا مانا کراوەتەوە: مەودای نێوان دوو چاڵی کارێز. (ر ـ ر)

دُبُور، کُصُوم، لَولاة. ذِهاب.

**پشتی**

ك: پاڵشت.[سەرین، بالیف]

ف: پُشتی، بالش.

ع: وَشیزَة، مُتَّکا.

**پشتی**

ك: کۆمەك، پشتیوانی، پاڵوپەنی.[لایەنگیری، یارمەتیدان]

ف: پُشتی، پُشتیبانی، پُشتیوانی، پُشت‌گیری، برنایشی، دَستیاری، کُمَک.

ع: حِمایَة، تَقویَة، مُؤازَرَة، مُساعَدَة، مُعاضَدَة، مَعاوَنَة، رِدء، مُظاهَرَة.

**پشتی**

[ك: پلوورەی هەنگ.]

ف: پُشتی، کندو، کَباره، گُواره، کوزەی انگبین.

ع: خَلِیَّة، قَفیر، مَشار، شُورَة، مِشوارَة. خَشاء. خَشرَم.

وێنە

**پشتیر←تویلە** [(وشەیەکی کرماجیە.)] (کرماجی است.)

**پشتێن**

ك: پشتوێن، پژوێن.[ پژێن، کەمەربەند]

ف: کمر، کَمَربَند، پُشت‌بَند، تَک‌بَند.

ع: نِطاق، مِنطَق، مِنطَقَة، وِشاح، حِجاز، زُنجب، حِزام.

**پشتیوان**

ك: کۆمەك، پاڵوپەن، لاکۆشکە.[یاوەر، یاریدەر]

ف: پُشتیبان، پُشتیوان، اَندخَس، برنایشت، پُشت‌گیر، دَستگیر، کُمَک، هَواخواه.

ع: سَنَد، عَون، رِدء، مَدَد، غَوث، عَضد، معوان، ظَهیر، نَصیر، مُعین، مُقَوّي، مُمِدّ، مُظاهِر، مُؤازِر، مُساعِد، مُعاضِد، مؤَیِّد، مُعاوِن، ناصِر، حامِي، مُنجِد.

**پشتیوان**

ك: پشتکوڵ، تەنگ، شەمعەك.[راگیرکەری دیواری شکاو.]

ف: پُشتیوان، پُشتیبان، پُشتوان، پادیر، پازیر.

ع: کَلب، رُکن، سَنَد، رِدء، ظَئرَة، ظَهیرَة، زافِرَة، دِعامَة. اِزار، مَجَرّ.

وێنە

**پشتیوان**

ك: پاڵشت، باڵێن.[سەرین، بالیف]

ف: بالش، بالین، بالشت.

ع: مُتَکّا، وِسادَة، مِنبَذَة، مُرتَفِق، نَمرَقَة، مِصدَغَة، مِخَدَّة، زِربِيّ

وێنە←باڵێن

**پشتیوانی**

ك: کۆمەکی، پشتووری.[یارمەتی]

ف: پُشتیبانی، پُشتیوانی، کمک، هَمراهی، هَواخواهی، برنایشتی، اَندخَسی، پُشت‌گیری.

ع: رَدء، اِمداد، تَقوِیَة، اِغاثَة، نَصر، تَأیید، حِمایَة، اِنجاد، مُعاوَنَة، مُعاضَدَة، مُظاهَرَة، مؤازَرَة، مُساعَدَة.

**پشك**

ك: بەش.[پاژ. قورعە]

ف: پشک. بخش.

ع: قُرعَة. سَهم، نَصیب، حِصَّة، قِسمَة، حَظّ، شِقص، خَلاق.

**پشك**

ك: پژگ. (چرکڵەی خیگە)[پینەی دارینی خیگە و مەشکە.]

ف: چوبَک. (چوبَک خیگ)

ع: زاجِل، اُسکوبَة.

**پشکۆ←سکڵ** [(وشەیەکی کرماجیە)] (کرماجی است.)

**پشکۆڵ**

ك: پشتکوڵ، باڵێن، پژدەر.[داری دەرگا داخستن.]

ف: مافه، بَسکَله، دَستور، تَنبه، تَبَندَر، پَژدَر، فَژدَر، فَژدَره، فَزوَره، پَژوَند، پَژاوَند، پَراوَند. فَردَر، فَرادَر، فَردَره، فَروَد، فَروَده، فَدوَند، فَروَند، فَراوَند، فَروَنده، فَدرَنگ، دَریواس، پُشتیوان، پُشتیبان، مَتَرس.

ع: شِجار، قُناح، لَزَز، دِعَامَة، مِتَرَس، مِتَرَسَة، مِتراس.

وێنەی هەیە.

**پشکۆڵ**

ك: قوڵ، قوتوقوڵ.[زەبەلاح (پیاوی زل و نەستوور.)]

ف: بشکول، بژکول. (مرد گنده و کلفت)

ع: جَحرَب، بُحتُری.

**پشکەڵ**

[ك: پشقڵ]

ف: پشک، پشکر، پشکَل، پشکَله، پُچُشک.

ع: بَعر، بَعرَة، ذَبلَة، فَناة، اَلو.

**پشکیل**

[(ك: ئەنگوستیلەی بێ نقێم کە یاری پێ دەکەن.)]

ف: کَچه. (انگشتر بی‌نگین که با آن بازی کنند.)

ع: خاتام، خاتَم.

**پشکێلان**

ك: کاڵەمشتێ.[یاری کاکڵەمشتێ (کە بە هەردوو دەست دەیکەن.)]

ف: کَچه بازی. (با هر دو دست بازی کنند.)

ع: فِئال.

**پشکێلان**

ك: تاقمانەجفت.[یاری تاقمان لە جووت (کە بە یەك دەست دەیکەن.)]

ف: تاق جُفت. (با یک دست بازی کنند.)

ع: زَوج فَرد، لَعبُ الزَّوجِ و الفَردِ.

**پشە←پژە**

**پشی**

[ك: جۆرە کولێرەیەکە.]

ف: بشی، بُرساق.

ع: بَسیسَة، قَطیفَة.

**پشێ**

ك: کتك.[پشیلە]

ف: پشی، گربه.

ع: بِشّي، هِرَّة.

وێنەی هەیە.

**پشیان**

ك: پژیان، وەشیان.[پرژان]

ف: پاشیده‌شدن، شپیخته شدن، اشپوخته شدن، پَشَنجیده شدن.

ع: تَرَشُّش، تَرَشُّح، اِنتِضاح، اِنتِضاخ.

**پشیلە**

ك: بەچکە کتك. کتك.[بەچکە پشیلە. پشیلە]

ف: بَچه گُربه. گُربه.

ع: شِبرِق، هُرَیرَة. هِرَّة.

**پف**

ك: فوو.[با دەرکردن لە دەمەوە.]

ف: پف، فوت، فوب، پوک.

ع: نَفخ.

**پف‌پیاکردن**

[ك: ماشینەوە: بە تەواوی خواردن. بە تەواوی تاڵان کردن.]

ف: همه را خوردن. همه را بردن.

ع: قَعف، قَعر، اِشتِفاف. غارَة.

**پف دان**

[ك: فوو تێکردن]

ف: پف دادن.

ع: نَفخ.

**پفدریاگ**

[ك: فووتێكراو]
ف: پف داده شده.

ع: مَنفوخ.

**پفەك**

ك: تیرتیرێن، ئاغزی تفەنگ.[(قامیش یا دارێكی كلۆرە كە بە فووپیاكردن تیری پێدەهاوێژن.)]
ف: پُفَك، تُفَك، فُتَك، تُزنَك.

ع: مِنفَخَة، مِدفَعَة.

وێنە

**پل**

[ك: چەقەنە]
ف: اَنگُشتَك، بشكَن.

ع: نَقر، ضَرب.

**پل**

ك: تیە، برووسكە. (پل ئەوەشێنێ.)[تەزووی بەژان. (پل وەشاندنی ئێش.)]
ف: تیرك، كنشك. (جستن درد.)

ع: ضَرب، تَوَجُّع.

**پل**

ك: ئەنجە، جنكە.[وردەپارچە. (وەك: پلی گۆشت.)]
ف: اَنجه، پاره، تیكه. (گوشت مثلاً.)

ع: شَرحَة، قَطعَة، بِضعَة، زیمة، حُذَّة، حُذوَة، فِدرَة، فِلذَة، مُزعَة، خردَلَة.

**پل**

ك: تار، خول، سوور، با.[(سووڕدانی تەشی یا تیۆك.)]
ف: تاب، چرخ، (تاب دادن دكلان یا تیر نان.)

ع: رَدنَة.

**پل**

ك: كلك، ئەنگوس. (دەسوپل، دەموپل)[(پەنجەی دەست.)]
ف: انگشت. (انگشت دست.)

ع: اِصبع، اَنمِلَة.

**پلانن**

ك: تلانن، گلانن.[تل دان، تلاندن]
ف: غَلتاندن، گَرداندن، غالاندن.

ع: دَحرَجَة، دِحراج، دِخار، دَهدَهَة، زَحلَفَة.

**پلانن**

ك: تلانن، پلكانن. ساوین. ناوین.[تێهەڵژەندن، تێهەڵسوون]
ف: آغشتن، آگشتن، آگستن، آلودن، جُترانـدن، آغشته كردن، آلوده كردن، جُتره كردن.

ع: لَطخ، لَتخ، طَلي، طَمل، لَوث، تَلطیخ، تلتیخ، تَطلیَة، تَطمیل، تَلویث، ضَرج، تَضریج.

**پلاننەوە**

ك: پلانن.[(هەردوو ماناكەی. كە پیتی «وە»ی دووپاتكردنەوەی خراوەتە سەر.)]
ف:←پلانن. (بە هـر دو معنـی آن، كـه «وه»ی عودت بر آن افزوده شده.)

**پلپل**

ك: ئەنجەئەنجە، جنكەجنكە.[جنراو، ئەنجنئەنجن]
ف: انجەانجە، پارەپارە، تیكەتیكە، پارچەپارچە.

ع: مُتَقَطِع، مُتَبَضِّع، مُتَحَذِّي. قِطَعاً، شَرَحاتٍ، خَرادِل، زِیَماً. اِرباً اِرباً.

**پلپل كردن**

ك: ئەنجە ئەنجەكردن، جنكەجنكە كردن.[ئەنجنین]
ف: اَنجیدن، اَنجین كردن، اَنجەاَنجە كردن، پارچەپارچە كردن، تیكەتیكە كردن.

ع: تَقطیع، تَشریح، تَاریب، تَهریم.

**پلپلی**

ك: پلپلین، بەڵەكبەڵەك، بازگ.[دووڕەنگ، پەڵەپەڵە]
ف: پیسه، خَلَنگ، خَلَنج، لَكلَك، لَكەلَكە، بُلبُلی، دورَنگ. بَهَك دار، سَرچَپدار.

ع: اَبرَش، اَبرَص، اَبلَق، اَنمَش، بَهِق، نَمِش، ذو

بَهَق.

**پلتۆك**

ك: پلتۆك.[پته: به پشتی پەنجه له شت دان.]

ف: تلَنگ، تلَنگُر، تَلَنگور.

ع: نَقفَة، نَطبَة، نَقرَة. نَقر، نَقف، نَطب.

**پل‌تەقانن**

[ك: چەقەنه لێدان]

ف: انگشت زدن، بشکن زدن.

ع: نَقر، اِنقار.

**پل‌تەقێن**

ك: چەقانەژەن.[سەماکەری چەقەنەلێدەر.]

ف: یافَر، دست‌افشان.

ع: نَقّار، رَقّاص.

**پلج←پان**

**پلچانن←پانەو کردن**

**پلکانن**

ك: تلانن، پلانن.[تێهەڵژەندن، تێهەڵسوون]

ف: آغشتن، آلودن، آگَستن.

ع: لَطخ، طَلي، طَمل، تَلطِيخ، تَطلِيَة، تَطمِيل، تَضرِيج، تَلوِيث.

**پلکیان**

ك: پلیان، تلیان.[تێهەڵژنان، تێوەچوون]

ف: آغشته شدن، آگَسته شدن، آلوده شدن، جُتره شدن.

ع: طَمَل، تَطَمُّل، تَلَطُّخ، تَلَثُّخ، تَطَلّي، تَضَرُّج، تَلَوُّث.

**پلوپا**

ك: پرِوپـا، پاوپـل، توانـا.[قولوقـاچ، هێـز (وەك: پلوپـای ڕۆیشتن.)]

ف: توانایی، پَروپا. (راه رفتن مثلاً.)

ع: قُوَّة، قُدرَة، اِستِعداد، لِیاقَة.

**پلوپا**

ك: تەلاش، کۆشش.[هەوڵدان، تەیار کردن]

ف: تلاش، کوشش.

ع: سَعي، جَهد. تَهیِّة.

**پلوپووش**

ك: پووشوپلاش، پووشاڵ، خاشاڵ.[دڕکوداڵ]

ف: خس و خاشاک.

ع: غُثاء، قَشّ.

**پلوور**

ك: پلووسك.[لووس، لووساوك]

ف: نیو، سُر، سلک، شلکَک، ناوه، ناودان.

ع: مَثعَب، مِزراب، مرزاب، میزاب.

وێنه

**پلوور**

ك: لووله، شمشاڵ.[بلوێر]

ف: نَی، نای، توتَک، غَرو، دورای، دوزای، نَی‌لَبَک.

ع: مِزمَر، مِزمار، شَبّابَة، یَراع، نای.

وێنه←پلوورژەن ‹۲›

**پلوورژەن**

ك: لوولەژەن.[بلوێرژەن، بلوێرلێدەر]

ف: نَی‌زَن، توتَک زَن.

ع: زَمّار، قَصّاب.

وێنه

**پلووسك←پلوور**

**پله**

ك: پلەکان، پا.[پلیکانه، قادرمه]

ف: پلّه، تَلّه، پایه، پَک، شپل، شپلَت، اَرچین، پایگاه، زینه.

ع: دَرَجَة، قَصمَة، قَصفَة، مِرقاة. قَصفان.

**پله**

ك: پایه.[دەرەجه، ئاست. قەدر، ڕێز]

ف: پلّه، پایه، پایگاه، پایگَه، نیا، دَرج، اَرج، اَرز،

بلندی، بزرگی.

ع: قَدر، مَنزِلَة، مَرتَبَة، مَقام. عِزَّة، كَرامَة.

**پله**

ك: پا.[دەرفەت]

ف: پا، رُستی، ویل.

ع: فُرصَة، نَهزَة.

**پله**

[ك: تيـل: بـە پەنجـە لـە هـەڵمات دان. (زاراوەيەكـە لـە هەڵماتێندا.)]

ف: اَنگُـــشتَک، تلَنــگ، تلَنگـــور. (اصـــطلاح گلولەبازی است.)

ع: نَطبَة، نَقرَة، نَقفَة.

وێنه

**پله به ناوا دان**

[(ك: خراپەكاری.) ئیدیۆمە.]

ف: پل به آب زدن. (کار خراب کردن.)

ع: تَخريب الأمر، هَدم الطَّريق.

**پلەپرتكێ**

ك: پەله، پەلەپەل، پەلەفرتكێ.[پەلەپڕووسكێ: زۆر پەلـه كردن.]

ف: شتاب، فَرفَره، چُلبُله.

ع: عَجَلَة، سُرعَة، مُبادَرَة.

**پلەترازيان**

ك: شلەوبوون، پەشيمانەوبوون.[پەژیوان بوونەوه]

ف: سُــست شــدن، پــشیمان شــدن، پلّــه از جـا درآمدن.

ع: نَدَم، سَدَم، اِنزِلاج.

**پلەترازيان**

ك: لە پلە دەرچوون، پلە تسيان.[لە پلە تسان (دەرچـوونی خۆتەویستی هەڵمات لە نێوان پەنجەوە.)]

ف: اَنگُشت رها شدن، اَنگُشتَک در رفـتن، تلنـگ در رفــتن. (غفلتـاً گلولــه از بــین انگــشت رهــا شدن.)

ع: تَزَلُّج. (تَزَلَّجَ البُندُقُ عَن يَدِهِ.)

وێنه←پله

**پلەتسيان←پلەترازيان (لە پلە دەرچوون)**

**پلەزيقان**

ك: خۆشــیخۆشــی.[شــادی كــردن (بــە دەم چــەقەنە لێدانەوە.)]

ف: شــادی، شــادمانی، خوشــیکــردن، شــادی کردن. (با انگشتک زدن.)

ع: زَعق، زَجَل، عشرَة، مَسَرَّة. (مَع الفَرقَعَة)

**پلەكان**

ك: پله.[پلیكانه، قادرمه]

ف: پله، پلُکان، پَغنه.

ع: قَصفَة، قَصمَة، قَصفان، مِرقاة، دَرَجَة.

وێنه

**پلەكان حەوز**

ك: پلەكان.[قادرمەی حەوز]

ف: پله، پایاب.

ع: دَرَكَة.

**پلەمەته**

[ك: سمه، مەته، درێل]

ف: پَرماه، پَرماهـه، پَرمَه، بَرماهـه.

ع: مِثقَب.

وێنه

**پلەنيان**

ك: پاكلەنیـان، هەڵخرانن.[هەژاندن، هاندان]

ف: آغالیدن، اغاریدن، بـرانگیختن، شـورانیدن، فژولش.

ع: اِغــراء، اِغــواء، تَحريــك، تَحــريص، تَحــريش، تَوريش.

**پلەی پەینجه**

[ك: پلیکەی پەیژە]
ف: پلەی نردبان.
ع: ضِلع، اَضلاع السُلّم.

**پلیان**
ك: تلیان، گلیان.[تل‌خواردن، تلان، گلان]
ف: غَلتیدن، گَردیدن، تَلیدن، تلَو خوردن.
ع: تَدَحرُج، تَدَهوُر، تَدَهدُه.

**پلیته**
ك: فتیلە.[پلیتە]
ف: پَلته، فَتیله.
ع: ذُبالَة، فَتیلَة.

‹**پلیس**›
ك: شاگرد داروغە، پاسەوان.[پۆلیس]
ف: پاسبان، شاگرد داروغه.
ع: جِلواز، شُرطَة، شُرطِيّ، زَبانِيَة، قَلّاع، شِحنَة، بولیس.

**پلیسرک**
[ك: پەرەسێلکە]
ف: پَرَستو، پَرَستوک، پرستُک، فَرَستو، فَرَستوک، فَراستوک، فَراشترو، فَراشتروک، فَراشتُک، فَرَشتوک، فَرتوک، چلچله، بَلوایه، بالوایه.
ع: خَطّاف، خُطّف.
وێنە

**پلێ**
ك: جۆر. زوان. روو.[زمان، شێوە («دوروپلێ» واتە: دوروزمان، دووڕوو.)]
ف: جور. رو. زبان. («دوروپلێ» یعنی دوزبان، دورو.)
ع: وَجه، وِجهَة. خِلف. لِسان. (ذو وَجهَین، ذو خِلفَین)

**پلاس**
[(ك: جاجمی سپی.)]
ف: پَلاس، گوردین. (جاجم سفید)
ع: كِساء، مِرط، مِسح، بَلاس.

**پلاش**
ك: پووش، خاشاڵ.[وشکەگیا]
ف: خَلاشه، خاشاک.
ع: غُثاء، قَشّ، حَشیش.

**پلان**
ك: پێشە، سقان.[ئێسقان]
ف: استخوان، ستخوان.
ع: عَظم، عَرق.

**پلاو**
[ك: چێشتی برنجی پاڵێوراو.]
ف: پَلَو، پلاو.
ع: رُزّ. (تِمَّن)

**پلاوپیتو**
ك: قەلاقەلا. [پڕکراوی بەرزەوەبوو.]
ف: پَلاوپُر، مالامال.
ع: جُمام، جَمَم.
وێنەی هەیە.

**پلاوسافکەر**
ك: پلاوپالا.[برنج پاڵێو]
ف: اَردَن، آردَن، ماشو، ماشیوه، پالونه، پالوانه، پالاوان، پلوپالا.
ع: غَلَل، مِبزَل، مِصفاة.

**پلپ**
ك: سلپ، شل، پرپۆل. [خۆنەگرتوو]
ف: سُست، شُل.
ع: قَلتَة، رَخو، مَخشوب، مخضود. قَلع.

**پلپ بەستن**
ك: سفتەربوون. [مەیین، خۆگرتن]

ف: سفت شدن.

ع: اِشتِداد، اِستِحکام.

**پلپله**

[(ك: پلپله، پپلە (خشڵێکی ژنانەیەکە لە ئەشرەفــی یا شایی زیو دروست دەکرێت.)]

ف: زیوری است زنانه، از اشرفی یا شاهی نقره می‌سازند.

ع: ...

**پلتوك**

[ك: پته: بە پشتی پەنجە لە شتێکدان.]

ف: تلَنگ، تلَنگور.

ع: نَقفَة، نَطبَة، نَقرَة.

**پلمه**

ك: پرمە. (پرمەی گریان)[شیوەن، زاری]

ف: توف، گریه.

ع: شُهاق، عَویل، شِدّةُ البُکاء.

**پلنگ**

[ك: دڕندەیەکی بەناوبانگە.]

ف: پَلَنگ.

ع: نَمِر، عُسبُر، اَبرَد، اَرقَط.

وێنە

**پلنگی**

ك: پلپلی.[پەڵەپەڵە، خاڵخاڵ (ڕەنگێکە کـە خاڵگـەلێکی لــە ڕەنگێکـی تـر تێدایـە، بـە زۆری لـە کـوتردا بـەدی دەکرێت.)]

ف: پلنگی. (رنگـی اسـت کـه نقطـه‌هـا از رنـگ دیگر در آن باشد کـه بیـشتر در کبـوتر فـراهم می‌شود.)

ع: اَرقَط، مُرَقَّط، مُنَقَّط.

**پلوچ**

ك: پێچ، ناڕاس، نادرووس.[چەوت، خواروخێچ]

ف: پیچ، ناراست، نادُرُست.

ع: مُعَوَّج، مُتَقَلِّب.

**پنار**←**نەنكار**

**پناشت**←**پنداشت**

**پنداشت**

ك: پناشت. [گومان، بۆچوون]

ف: گمان.

ع: زَعم، ظَنّ، تَصَوُّر، تَوَهُّم.

**پنر**

[ك: تفت (تامی‌گیر، وەك: تامی مازوو.)]

ف: زَکش، زُمُخـت. (طعـم گیرنـده،ماننـد طمـع مازوج.)

ع: عَفِص.

**پنری**

[ك: تفتی (تامی‌گیر.)]

ف: زَکش، زُمُختی، گیری. (طعم گیرنده.)

ع: عُفُوصَة.

**پنه**

[(ك: مێزێك کە نانی لەسەر پان دەکەنەوە.)]

ف: پَهنه. (میزی که نان روی آن پهن کنند.)

ع: طُلم، طَبلِیَّة، لَوح، لَوحَة، خُوان.

**پۆ**

[(ك: تاڵی بەری پارچە کە بەرامبەری «تان»ە.)]

ف: پوده، پود، فود. (رشتـه‌ی عـرض جامـه کـه ضد «تار» است.)

ع: لُحمَة، نِیر، نایِل.

**پۆ**

ك: لەق، پەل. (لەقوپۆ)[لقوپۆپ]

ف: شاخه، آزَغ.

ع: غُصن، قَضیب.

**پۆ**

ك: پەڕ، پەل. (پەلوپۆ)[(تووکی باڵندە.)]

ف: پَر. (پر مرغ.)

ع: رِيش.

**پۆ**

ك: پەرژ.[ پیفوو (پوشووی بەرد و نەستیّ.)]

ف: پُـد، پُـده، بُـد، بُـده، پَرهـازه، آتـشگیـره. (کهنه‌ی سنگ و چقماق.)

ع: خَف، حُراقَة.

**پواز**

ك: هوّره، زوانه.[سنگێکه بۆ قلّیشاندنی دار.]

ف: بُـراز، بَـراز، بَـواز، بَفـاز، پُفـاز، پُغـاز، پانـه، پَهانه، فانه، فَهانه، زوانه، زفانه.

ع: سَفِين، شِکَة، لُسَينَة. مَشط.

وێنه

**پۆپ**

ك: قژ، زلّف، پۆپر.[بسك]

ف: گیس، گیسو، زُلف.

ع: لِمَّة، شَعَر.

**پۆپچەرمگ**

ك: قژچەرمگ. خزمەتكار.[سەرسپی. کارەکەر]

ف: گیس‌سفید. خدمتکار.

ع: شَمطاء، جَحمَرِش، عَجُوزَة، خادِمَة.

وێنه «۲»

**پۆپر**

ك: پۆپ، قژ. (سەر و پۆپر) [بسك]

ف: گیس، گیسو، بسوته، زلف.

ع: شَعَر، لِمَّة.

**پۆپل**

[ك: بەری درەختێکە لە فندق دەچێت.]

ف: پوپل

ع: فوفل.

**پۆپە**

ك: كلاونە، پۆپ.[پۆپنە]

ف: پـوپ، پوپـه، جـوج، خـوچ، خوچـه، بلـوچ، لالَک، خوراهـه.

ع: عُرف، مِغفَر، تاج.

وێنه «۲»

**پۆپە**

ك: قەلەپۆپە ، كلاوه. چیه.[ترۆپك، لوتکە]

ف: کَلّه، چَکاده، چَکاد، چَهاد، چَکاه، سَپکاد.

ع: قُلّة، ذُروَة، اَوج، قُنَّة، قُلة، قِلالَة، شَعَفَه، فَوق.

**پۆپەژمین**

ك: سەرەنناز.[سەرپۆش (لە خوری دەیچنن و زۆر تەنکە.)]

ف: دامَک، سرانداز. (از پشم می‌بافنـد و خیلـی تنک است.)

ع: مِقنَعَة.

**پوتین**

[(ك: جۆرە پێلاوێکە. (نیوچەکمە)]

ف: پوتین. (نیم چکمه)

ع: فوطین، بوطین.

**پوخ**

ك: پۆرتخ.[(کرۆکی برین.)]

ف: پیله، مغز. (مغز زخم)

ع: مُخُّ الخُراج.

**پوخت**

ك: کوڵ، کولاّن.[کولاندن، لێنان]

ف: پُخت، پُختن، پَزیدن.

ع: طَبخ.

**پوخت**

ك: چێشتەکوڵێن، بەش چێشتێ.[برێـك خـواردنی دیاریکراو بۆ لێنان.)]

ف: پخت. (مقداری معین برای طبخ.)

ع: طَبخ.

**پوختوپەز**

ك: ... دەسوپوخت.[چێشت لێنان]

ف: پختوپز.

ع: طبخ، طباخَة، طهايَة.

**پوختوپەز**

ك: ساخت و پاخت، سازوباز.[كەینوبەین]

ف: پختوپز، ساختوپاخت.

ع: تَباني، مُواضَعَة، مُعاهَدَة.

**پوختە**

ك: كولّیاگ. برژیاگ.[كولاو. برژاو]

ف: پُختە، پَزیدە.

ع: مَطبُوخ، مَشوِيّ.

**پوختەدەنی**

ك: كولّیاگ.[كولاو: ئەوەی بوّلێنان دەشێت.]

ف: پُختَنی، پَزیدَنی.

ع: مَطبوخ، مایُطبَخ.

**پوخڵ**

ك: شل، نەگەییگ، نەپوخت، خام، كال.[پێنەگەییو (بەرهەمی خوّتەگرتوو.)]

ف: سست، نارس، ناپُخت، خام، كال. (كار نارس)

ع: نَيّئ، فِجّ، غَضّ، فَلتَة، غَيرُ مُستَحكَم.

**پوخڵكار**

ك: سسكار، بوّلە، پەخمە، پریوڵ.[سەپوڵ]

ف: سُستكار، خامكار.

ع: غَشيم، غُمَر، اَخرَق، مُهمَل، مُرَمِّق.

**پوڕ**

ك: پان. (پانوپوڕ)[بەرین]

ف: پَهن، پَخت، پَخج، پَخش.

ع: عَريض، بَسيط، فِرطاس، فَريغ.

**پوڕ**

ك: پر، خەفە.[چڕ (وەك: دارستانی پر.)]

ف: اَنبوه، خَفه. (بیشەی انبوه مثلاً.)

ع: اَثیث. مَضیق.

**پوڕ**

ك: زرەكەو.[زیوەكەو]

ف: پور، تُراج، كَبک كر.

ع: حَیقُطان، دُرَاج.

**پوڕ**[1]

[ك: پشك]

ف: پشک.

ع: قُرعَة.

**پوڕا روین**

ك: بە پوڕا روین.[رابیتە: چاو نووقاندنی سوّفیەكان بوّ پەیوەندی كردن بە شێخ و روّحی پیاوچاكانەوە.]

ف: فرزندشاد.

ع: مُراقَبَة، رابِطَة.

**پوڕتخ**

ك: پوّخ.[(كروّكی دومەڵ.)]

ف: پیله. (مغز دنبل.)

ع: مُخُّ الخُراج.

**پوڕتك**

ك: كلاّو و دەسماڵ.[شەدە(ی ژنان.)]

ف: كلاه و دستمال. (زنانه)

ع: عَمّامَة، مِدماجَة.

وینە←پوّپچەرمگ «۱»

**پوڕخز**

ك: زەلام، زل، زلە.[زەبەلاح]

ف: پُرخز، فَرخز، فَخرز، فربه، گُنده، نَهمار.

ع: ضَخیم، جَسیم، قَطور، فَیلَم، قَويُ الهَیكَل.

**پوڕگ**

---

۱- ئەم وشەیە لە پەراوێزدا نووسراوە، لە ژێر ئەم وشەدا تاوا نووسراوە: «...ب استیر فصل ۳-۱-۷» كە سەرەتاكەی داكەوتووە و بوّم ساغ نەكرایەوە. (ر - ر)

ك: پەترۆكە، پەترۆ.[قرتماخە، سەربرین]

ف: تو، پوست تازه، پوست زخم، پوست دنبل.

ع: قِرفَة، جُلبَة، غَلافُ الْخُراج.

**پۆریان**

ك: گونجیان، چلیان.[راستهاتن، گونجان]

ف: گُنجیدن، درست آمدن.

ع: صلُوح.

**پۆز**

ك: پۆزە، قەپۆزە.[دەمولەوس (دەوروبەری دەمی مرۆڤ یا ئاژەڵ.)]

ف: پوز، پوزه، فوز، فوزه، فوس، بَرپوز، بَرفوز، تَبفوز، فَریش، نُس، فَدرَنجَک، تَبفور. (پیرامون دهان. خواه انسان یا حیوان.)

ع: خَطم، فِنطیسَة، فِرطیسة، فَطّیسَة.

**پۆزە←پۆز**

**پۆزەبەن**

ك: پۆزبەن، دەمبەس، قەمتەر، پۆزەوەن.[زاربێنی ئاژەڵ.]

ف: پوزبند، دهن‌بند.

ع: غِمامَة، كِمامَة، مِكَمَّة.

وێنە

**پۆس**

ك: پێس، تۆك.[پێست (وەك: پێستی لەش.)]

ف: پوست. (پوست بدن مثلاً.)

ع: جِلد، غِشاء.

**پۆس**

ك: تۆك، تۆكڵ.[توێکڵ (وەك: توێکڵی هێلکە.)]

ف: پوست. (پوست تخم مرغ مثلاً.)

ع: قِشر، قِشرَة، قَیض.

**پۆس**

ك: تۆك، تۆكڵ.[توێکڵ (توێکڵی دار.)]

ف: پوست. (پوست درخت.)

ع: لِحاء، قِشر، قُرافَة.

**پۆس**

ك: چەرم.[پێستی خۆشەکراو.]

ف: پوست، چرم، پوس.

ع: جِلد، اِهاب. (اَدیم)

**پۆس**

ك: پێس.[کاغ (پێستی ناسك‌کراو بۆ نووسین یا بۆ دەف.)]

ف: پوست. (پوست نازک شده برای کتاب یا داریه.)

ع: رَقّ، سِحاء، قَضیم.

**پۆس**

ك: پۆسە، چەپەر.[پۆستە]

ف: پست، پوسته، چاپار، اسک، اسلدار.

ع: بَرید، سِكّي.

**پۆس**

ك: قەرەوڵ، کێشك.[پاسەوان]

ف: پُست، یَزَک، قَلاوَز.

ع: رَبیئَة، جِلواز.

**پۆسانن**

ك: پرتووکانن.[پواندن، رزاندن]

ف: پوساندن، فَرسوده‌کَردن.

ع: تَبلیَة، اِخلاق، اِفساد.

**پۆسپارە**

[ك: پارچەکەوڵ.]

ف: زغراش، پوست‌پاره. (تیکه‌ی پوستین)

ع: قِطعَة الْفَرو.

**پۆس پەنیر**

[ك: خیگەی پەنیر.]

ف: پوست پنیر، خیگ پنیر.

ع: شَكوَة، سِقاء الْجُبُنّ.

**پۆس‌پەنیر**

ك: خیگە، زەلام.[زەبەلاح (خوازەیە.)]

ف: فَربه، گُنده. (مجاز است.)

ع: فَیلَم، ضَخیم، قَطور، شَکوة.

**پۆس خورما**

[ك: ریشاڵ و لفکەی دارخورما.]

ف: پیشَن، پیشَند.

ع: مَسَد.

**پۆس خەتەنەگا**

ك: خرۆسە.[چووك (پێستی خەتەنەگا کە سوننەتی دەکەن.)]

ف: خروسک، خُروسه. (پوست ختنەگاه کە بریده می‌شود.)

ع: قُلفَة، غُلفَة، غُرلَة، عُذرَة.

**پۆس کراننەوە**

ك: تۆکڵ کراننەوە.[لێکردنەوەی پێست بە ددان.]

ف: پوست به دندان کشیدن.

ع: تَعَرُّق، تَرَمُّم، اِنتِشال، اِنتِهاس، عَرق، عَرم، نَحض، جَلف، لَفو، نَهس، لَفَا.

**پۆس کراننەوە**

ك: خوسپ‌کردن.[غەیبەت کردن، پاشملە باس کردن. (خوازەیە.)]

ف: پَرتاد، دُشت‌یاد، زُشت‌یاد. (مجاز است.)

ع: غَیبَة، اِغتِیاب، وِشایَة، هَمز.

**پۆس‌کلفت**

[ك: پێستنەستوور]

ف: پوست‌کُلُفت.

ع: ضَخیمُ الجِلد.

**پۆس‌کلفت**

ك: بێشەرم، بێ‌ئاروو.[بێحەیا]

ف: بلاتِه، بی‌شَرم، بی‌آبرو، پوست کلفت.

ع: مُجَلَّد، بَذِيّ، وَقِح، بَذِيء، شَرِس، شَکِس، ذَرِب.

**پۆس کەنن**

[ك: گوورین، کەوڵ کردن]

ف: پوست کندن.

ع: سَلخ، دَرع. لَحي، مَلع، زَقّ، تَزقیق.

**پۆس کەنن**

ك: پۆس کراننەوە.[پاشملە باس کردن (خوازەیە)]

ف: پَرتاد، زشت‌یاد، دشت‌یاد. (مجاز است.)

ع: غَیبَة، اِغتِیاب، وِشایَة. هَمز.

**پۆسکەنە**

ك: ئاشکرا، بێپەردە.[روون، بێ‌پێچوپەنا]

ف: پوست‌کنده، آشکار، بی‌پرده.

ع: واضِح، صَریح، مُقَشَّر.

**پۆس کرتنەوە**

ك: پۆس کەنتنەوە.[پاك کردن، توێکڵ لێکردنەوە]

ف: پوست کندن، پوست باز کردن.

ع: قَشر، تَقشیر، کَشط، لَحي، شَذب، فَرك، حَتّ.

**پۆس لکیان بە بینشەوە**

ك: لەڕبوون، لەڕی.[لاواز بوون (لکانی پێست بە ئێسقاندا.)]

ف: چسپیدن پوست با استخوان، لاغرشدن، لاغری.

ع: لُصوغ، لَصَف، ضُمور.

**پۆس لێکردنەوە←پۆس کرتنەوە**

**پۆس لێکەنتنەوە←پۆس کرتنەوە**

**پۆس لێکرتنەوە←پۆس کرتنەوە** [ئامرازی پەیوەندی و راناوی «ی»ی خراوەتە سەر.)] (به اضافەی حرف جرّ و یای ضمیر)

**پۆسە←پۆس** [(هەر حەوت ماناکەی. )](به هر هفت معنی که ذکر شد.)

**پۆسەخانە**

ك: چەپەرخانە، پۆسخانە.[پۆستەخانە]

ف: پُست‌خانه، پُسته‌خانه، چاپارخانه، اسک‌گاه، اسکدارخانه.

ع: سِکَّة.

**پۆسیان**

ك: پرتووکیان، دارزیان. گەنین.[پووان، رزین]

ف: پوسیدن، فَرسودن.

ع: بَلي، قَضي، نخر، اِنخِلاق، عَنَت.

**پۆسین**

ك: کەوڵ، کەڵپۆس.[فەرو]

ف: پوستن، کَول، کَبَل، گُرگینه، دیوجامه.

ع: فَرو، مُستَقَة.

**پۆسین←پۆسیان**

**پۆش**

ك: پۆشە.[تەختەپۆش، قات، نهۆم]

ف: پوش، پوشه، اَشکوب، اَشکو، زُمو، نَزه.

ع: سَقف، غَما، غِماء، مَرتَبَة، طَبَقَة، دَرَجَة.

**پۆشاك**

ك: جل، سیپاڵ، پۆشەن.[جلوبەرگ]

ف: جُل، رَخت، جامه، پوشیدنی، پوشَن، پوشَنی، پوشَنه، پوشاک، پوشش.

ع: لِباس، کِسوَة، ثَوب.

**پۆشان**

ك: پۆشین، بەرکردن.[لەبەر کردنی جلوبەرگ.]

ف: پوشیدن، برکردن.

ع: لَبس، تَلَبُّس، اِکتِساء.

**پۆشانن**

ك: بەرکردن.[جلوبەرگ کردنه بەر کەسێکی تر.]

ف: پوشاندن، پوشانیدن.

ع: لَبس، اِلباس، اِکساء، کَسو.

**پۆشانن**

ك: پۆشین، پەنام کردن، شاردنەوە.[داشارین، حەشاردان]

ف: پوشانیدن، اَبَشتن، آبشتن، نهان کردن، پنهان کردن، پوشیدن، پنام کردن.

ع: کَتم، سَتر، غَفر، غُفور، غُفران، مَغفِرَة، تَغطِیَة، تَغشِیَة، تَورِیَة، اِخفاء.

**پۆشته**

[ك: جلوبەرگ لەبەرکردوو.]

ف: پوشته.

ع: کاسِي، مُلَبَّس.

**پۆشه**

ك: پۆش، تەختەپۆش.[تەختەبەندی سەرمیچ. هەروەها: قات، نهۆم]

ف: پوش، پوشه. اَشکو، اَشکوب.

ع: سَقف، غَما، غِماء. مَرتَبَة، طَبَقَة، دَرَجَة.

**پۆشەن**

ك: پۆشاك، سیپاڵ.[جلوبەرگ]

ف: پوشَن، پوشَنه، پوشَنی، پوشیدَنی، جامه.

ع: لِباس، دِثار، کِساء، کِسوَة، ثَوب، غِطاء.

**پۆشیده**

ك: پەنام، شاریاگەوە.[داپۆشراو، شاراوە]

ف: پوشیده، پَنام، نهان، پنهان، نهانی، راز، رازه، نهفته، آبشته، اَبشته.

ع: مَخفِيّ، مَستور، مَکتوم، خَفِيّ، سِرّ، مُغَطّی، مُوَرَّی.

**پۆشین**

ك: بەرکردن، پۆشانن.[لەبەر کردنی جلوبەرگ.]

ف: پوشیدن، برکردن.

ع: لَبس، تَلَبُّس، اِکتِساء.

**پۆشین**

ك: پۆشانن، شاردنەوە، پەنام کردن.[داپۆشین، حەشاردان]

ف: پوشیدن، پَنامکردن، نهان کردن، پنهان کردن، نهفته کردن، اَبشتن، آبشتن.

ع: کَتم، سَتر، اِخفاء، غَفر، اِلباس، تَغطِیَة، تَغشِیَة، تَورِیَة.

**پۆشین**

[(ك: جۆرە سەرپێچێکی ژنانەیە کە لە هەورێشمی رەش دروستی دەکەن.)]

ف: پوشین. (نوعی است از کلاغی زنانه که از

حریر سیاه می‌سازند.)

ع: ...

**پوك**

[ك: مژ: هەڵمژینی دووکەڵی جگەرە یا نێرگەلە.]

ف: پُک.

ع: نَفَس، اِستِنشاق.

**پۆله**

[ك: پۆیله: لیزگه مووروویەك كه بۆ جوانی له سەری دەدەن.]

ف: ...

ع: ...

وێنه ‹۲›

**پۆل**

ك: پۆل، پۆلك، تیپ، گەل.[دەسته]

ف: جوق، جوقه، دسته، گله، جَفالَه.

ع: سِرب، جَمع، ثُكنَة.

**پۆلا**

[ك: پۆلاد]

ف: پولاد، سَنَی، شابُرَن، شابورَن، شابورگان.

ع: ذَكَر، فُولاد، شابورقان.

**پۆلاخوەر**

ك: شمشێرکرۆژ.[ئازا، دلێر]

ف: پولادخای، دلیر، دلاوَر.

ع: شَجیع، خاضِمُ السَّیف.

**پۆلانیا**

ك: دەمەزەرد.[سەرنیا]

ف: دَمەزَرد.

ع: تَذکیر. ذُکرَة.

**پۆلك**

ك: پۆل، پۆل، تیپ، گەل.[دەسته (وەك: پۆلی باڵندە.)]

ف: جوق، جوقه، تیپ، گَله، دسته، جَفاله.

(جمعی از طیور مثلاً.)

ع: سِرب، ثُكنَة، جَمع.

**پونكه**

[ك: پوونگ، پنگ]

ف: پودنه، غاغه، رافونه، راقوته.

ع: حَبَق، غاغَة، فُودَنَج، بَقلَةُ القُدس.

وێنه

**پونكەكێفیله**

[ك: جۆرە پوونگەیەكی خۆڕسكه.]

ف: رُتَک، مُشک ترامُشبع، مُشک مُشیع.

ع: بَقلَةُ الغَزال، مِسكُ الطَّرامُشیع، فَودَنَج جَبَليّ.

**پووت**

ك: پووتەڵ، پووچ، پووچەڵ. هوڵوڵ.[بۆش، كلۆر]

ف: پوک، پوچ، کرَو، کاک، کاوَک، کاواک، بی‌مغز، تُهی.

ع: خَشل، اَجوَف، خالِي.

**پووتەك**

ك: خوەرە، كفت.[خۆرە (كزانەوەی توند، كه بەشێكه له گولی.)]

ف: لوری، خُورَه، کوفت. (سوزاک سخت، که قسمی است از پیسی.)

ع: جُذام، آكِلَة.

**پووتەكا**

ك: پاڵوو، هەنگڵ، كەلەكە، بنەگڵ.[تەنشت، خاڵیگه]

ف: کَش، پَهلو، تهیگاه، آبگاه.

ع: اِطل، خاصِرَة، خَصر، دَفّ، حَقو، قُرب، جَنب، جانِب، سُقلَة، طَرَّة، شاكِلَة، صُقلَة، كَشح.

**پووتەڵ←پووت**

**پووچ**

ك: بێهوودە، بێخوێ، بێبرێ.[بێئاوەڕۆك (قسەی بێهوودە و بێ مانا. خوازەیه.)]

ف: بیهوده، پوچ، فَرخَنج، بی‌چَم. (حرف لغو بی معنی. مجاز است.)

ع: لَغو، هَذَر، باطِل، واهِي.

**پووچ←پووت**

**پووچەڵ←پووتەڵ**

**پووچەو بوون**

ك: لەناو چوون.[پووچەڵ بوونەوە، تیاچوون]

ف: نیست شدن، نابود شدن، ازمیان رفتن، نفله شُدن.

ع: فَساد، بُطلان، اِنمِحاء،اِنعِدام، فَناء.

**پووچەو كردن**

ك: لەناو بردن.[پووچەڵ كردنەوە، تیابردن]

ف: نیست كـردن، نـابود كـردن، از میـان بـردن، نفلەكردن.

ع: اِفساد، اِبطال، مَحو، اِمحاء، اِعدام، اِفناء.

**پوور**

ك: میمك. (ئاباجی. خامباجی)[(ئاباجی، خوشكی بـاوك. خامباجی، خوشكی دایك.)]

ف: آغباجی، خواهر پدر. خانم باجی، خـواهر مادر.

ع: صِنوَة. (عَمَّة. خالَة)

**پوورە**

ك: هەنگ، دەسە.[كۆمەڵ]

ف: هَنگ، دَستە، تودە.

ع: حِزب، جَمعِیَّة.

**پوورە**

[ك: كۆمەڵەی هەنگ.]

ف: تودەی زنبور.

ع: حَشرَم، ثُول.

وێنە

**پوورەدان**

[(ك: بێچووە هەنگ كە پلوورە بەجێ دەهێڵێت و پلـوورەی نوێ ساز دەكات.)]

ف: تودەزدن. (پرواز كردن بچە زنبور از لانـە و تشكیل جدید آن.)

ع: تَطارُد. طَرَد.

وێنە←پوورە

**پووز**

[ك: بەلەك (نەرمەی ساقپا.)]

ف: خُز. (نرمەی ساقپا)

ع: حَمَأَة.

وێنە

**پووزەوان**

[ك: بەلەكپێچ (شتێكە وەك ساقی گۆرەوی كە شـاترەكان[1] لە پێی دەكەن.)]

ف: بادیج، وادیـج. (چیـزی اسـت ماننـد سـاق جوراب كە شاطران پاكنند.)

ع: مسماة.

وێنە

**پووش**

ك: پووشاڵ، پڵاش، خاشاڵ، پووشاك.[وشكەگیا]

ف: خَـس، خَـسَك، خَـش، خَـشَك، خاشـاك، خاشە، خَلاشە.

ع: غُثاء، قَشّ، حَشیش، قَذَی، قَذاة، قَزَع.

**پووشاك←پووش**

**پووشاڵ**

ك: پووش. ریشۆڵ.[وشكەگیا]

ف: خَـس، خَـسَك، خَـش، خَـشَك، خاشـاك، خاشە، خَلاشە. پریچە.

ع: غُثاء، قَشّ، حَشیش، قَذَی، قَذاة، قَزَع. لیف.

**پووشانە**

[(ك: ئەو باجەی كە ئاغا لە بەرامبەر كەڵك وەرگرتن لـە سـوورتەمەنی و پـووش و پەڵاشـی دەشـتەوە لـە رەعیـەتی دەسێنێت.)]

---

١- شاتر: ئەو نانەوایەی كە نان پێوە دەدات. (ر ـ ر)

ف: پول خَسَک. (پولی است که مالک از رعیت می‌گیرد در مقابل اینکه سوخت و خلاشه‌ی صحرا به مصرف می‌رساند.)

ع: غُثائِیَّة.

**پووش دیان**

ك: دیانپاکەوکەر.[دانئاژن]

ف: خلاشه، دندان پَریز، دندان آپریز، دندان بَریز، دندان پَریش، دندان آپریش، دندان فَریش، دندان آفریش، دندان فَریز، دندان آفریز، دندان کاو.

ع: خِلال.

وێنە←دیانپاکەوکەر

**پووشڵە**

[(ك: پرووشی لۆکە پێداپێچراو کە ژەنگی ناو گوێی پێ پاك دەکەنەوە و وەك لۆکەی دەرمان تێوەدراو دەری دەهێنن.)]

ف: پرزه. (خلاشه‌ی پنبه پیچیده که با چربی گوش آلوده مانند شاف بردارند.)

ع: فَرزَجَة.

**پووشوپلاش**

ك: پلوپرووش، پرووش.[وشکه گیا]

ف: خَس و خاشاک، خَش و خاش، خش و خلاشه، خلاشه و خَشَک.

ع: اَلقِشُّ و الغُثاء.

**پووشوو←پیفك** [(وشەیەکی کرماجیه.)] (کرماجی است.)

**پووك**

ك: پورکاوڵ، پەنجوڵە.[چەموڵە]

ف: تال، پَنجول.

ع: وَکر، اِفاصَة. (اَفاصَ فِي وَجهِه.)

وێنە←پووکاوڵ

**پووك**

ك: پووت، پووتەڵ، هوڵوڵ.[پووچ، بۆش]

ف: کاواک، کاوَک، کاک، کرَو، پوک، تُهی.

ع: خَشل، اَجوَف، مُجَوَّف، خالِي.

**پووك**

ك: هاروو.[پدو: گۆشتی دەوری ردان.]

ف: آره، آرواره.

ع: لِثَّة، مَورِم.

**پووکاوڵ**

ك: پووك، چنگاوڵ.[چەموڵە]

ف: تال، پَنجول.

ع: وَکر، اِفاصَة.

وێنە

**پووکە**

[ك: نووکە (گریان بە دەنگی نزم.)]

ف: گریه. (گریستن آهسته)

ع: ضَراعَة، بُکاء.

**پووکەپووك**

[ك: نووکەنووك (گریان بە دەنگی نزم.)]

ف: گریه، گریستن. (گریه‌ی آهسته)

ع: ضَراعَة، بُکاء.

**پووول←پووڵ** [(سووکەڵەکراوە)] (مخفف است.)

**پووڵ**

ك: دراو.[پارە]

ف: پول، درَم.

ع: نَقد، عَین، نَضّ، ناضّ، وَجه، فُلوس. دینار. درهَم، درهام.

**پووڵ رەش**

[ك: پارەی وردە، پارەی مسی.]

ف: پَشی، پَشیز، پشیزه، پول سیاه.

ع: فَلس، فُلوس.

**پووڵەك**

ك: پووڵەکە.[(پوولکی ماسی.)]

ف: کُپ، پَشیزه، پُولَک. (پولَک ماهی)

ع: فَلس، سَهف، حَرشَف.

وێنە

**پووڵەك**

ك: پوولەکــە.[بریقــە (خــشڵێکی ژنانــە لــە تەنەکــەی ڕەنگاڕەنگ دەیبڕن و لە تەوێڵی دەدەن.)]

ف: پولَک، پَشیزه. (زینت زنانــه اسـت از حلبـی رنگارنگ میبُرند و به پیشانی میچسپانند.)

ع: فَلس، فَلسَة. حَوط.

وێنە

**پووڵەکە←پووڵەك** [(هەر دوو ماناکەی.)] (بـه هـر دو معنـی آن.)

**پوویاک**

ك: پرتووکیاگ.[پواو، پرتووکاو، ڕزیو]

ف: پوده، پوسیده.

ع: ناخِر، مَنخُور، نَخِر، بالي، هامِد، مُتَفَتِّت، قَضِئ، عَنِت، واهي، رَميم، فاسِد.

**پوویان**

ك: پرتووکیان.[پوان، پرتووکان، ڕزین]

ف: پودَن، پوسیدن، پوسیده شدن.

ع: نَخـر، بَلـي، هَمـد، هُمُـود، قَـضِئ، وَهـي، عَنَـت، تَفتُّت، رَميم، رَمّ، فَساد، اِنخِلاق، تَخَرُّق.

**پوە←کەرەپوە**

**پەپکە**

ك: گونك، گرموڵە، گرتکە. (پەپکە بەستن مار.)[گونکـە. هەروەها: پاپۆکە، چەمەر.]

ف: چونه، گُنده، گرده، گردکه، چَنبَره، چَنبَرَک.

ع: قُرصَة، شَوبَة، كُعبُرَة. حَلقَه، رَحَّة.

**پەپکەبەستن**

ك: پەپکەدان.[گرموڵەبوون (وەك: پەپکە بەستنی مار.)]

ف: گرد شدن، چَمبَرزدن. (مار مثلاً.)

ع: تَقَـرُّص، اِســتِقراص، تَحــوِّي، تَلَــوِيّ، تَرَحِّــي، اِنطِواء، اِستِدارَة، اِستِكفاف، تَطَوِّي، اِنقِباض.

**پەپکەدان←پەپکەبەستن**

**پەپکەمەلیچکانە**

ك: تۆڵەکە.[کولێرەچەورە: گیایەکە.]

ف: پَنیرک.

ع: خُبّازي، مُلُوكِيَّة.

وێنە←تۆڵەکە

**پەپوو**

ك: پەپووکەرە، پەپووسلێمانە.[شانەبەسەر]

ف: پوپـو، پوپـه، پـوب، پوپَـک، پـوپَش، بوبـو، بوبه، بوبویه، بُدبُدَک، شـانەسَـر، کوکلـه، مـرغ سلیمان.

ع: هُدهُد.

وێنە

**پەپوو نەخوێنێ**

ك: چۆڵە، ئاوائە.[چۆڵ و هۆڵە. (ئیدیۆمە.)]

ف: تهی است. (کنایه است.)

ع: خالي، مُخَلّي، بائِر، غامِر، خافِق، خاوِي، خالي السُّكنَة.

**پەپووسلێمانە←پەپوو**

**پەپووکەرە←پەپوو**

**پەپوولە**

[ك: پەروانە]

ف: پَروانه.

ع: فَرَاشَة، خِرطِيط، فُرفُورَة.

وێنە

**پەپوولە**

[ك: پەپوولە هەڵهێنان (نەخۆشینێکی بزن و مەڕە.)]

ف: مرضی است در بز و گوسفند پیدا میشود.

ع: ...

**پەپە**

ك: کولێرە.[نەستوورك (وشەیەکی هەورامیە.)]

ف: گردَه. (اورامی است.)

ع: قُرصَة.

**پەت**

ك: پەتك، پەلەتك.[(گوریسی ئەستوور.)]

ف: پَت. (ریسمان زمخت)

ع: شِناق، شَنَق، وِكاء، رِبقه، رَسَن.

**پەتا**

ك: درم، هەلامەت.[تالأمەت، پەسیو]

ف: پتا، هَنگ، کاتوره.

ع: زُكام، غُمام، نَزلَة.

**پەتپەتی**

[ك: مەڵهەم]

ف: لاپه، کَهاب، کَهناب.

ع: ضَماد، مَرهَم.

**پەتپەتی**

ك: کەتن.[شەرمەزاری (ئیدیۆمە.)]

ف: پلشتی. آنچه نه بدتره.[1] (کنایه است.)

ع: سَيِّئَة، هَتيكَة، فَضيحَة، خِزَي.

**پەترۆ**

ك: پەترۆکـــە، پەترۆخـــە.[قرتاخـــە (کـــیم و زووخـــی وشکەوەبووی سەر برین.)]

ف: کرسنه، قرسنه. (چرک وریم روی زخم کـه سخت شده باشد.)

ع: قَرف، جُلبَة، رِيم.

**پەترۆ**

ك: گۆشتەورزوون.[گۆشتەزوونە (ئەو گۆشتە نوێیەی کە لە کاتی چاکبوونەوە لە برین پەیدا دەبێت.)]

ف: تـو، گوشـت تـازه. (گوشـت تـازه کـه زخـم هنگام بهبودی پیدا می‌کند.)

ع: قِرفَة، جُلبَة، قِشر.

**پەترۆخە←پەترۆ**

**پەترۆکە←پەترۆ**

**پەتك←پەت**

**پەتلە**

[(ك: گەنمی نیوەکوڵاو.)]

ف: پتله، پاتله. (گندم نیم پخت)

ع: خَضيمَة.

**پەتوو**

ك: تاپیاڵ.[بەتانی]

ف: پَتو، رَغزَه، اَدیال.

ع: مِرط، دِرنيك.

**پەتە**

ك: پاس.[پەساپۆرت]

ف: پَته، پاسپورت.

ع: جَواز، تَذكِرَة، فَسخ، فتة.

**پەتەڕی**

ك: شێت، گەوج.[گێژ]

ف: دیوانه، خُل، شپیل.

ع: سَفِيّ، سَفِيه، مَجنون، مَمسوس، اَبلَه، مَوسوس.

**پەت هەڵخستن**

ك: داردان، دارکێشانن، تاسانن، خنکانن.[لەسێدارەدان]

ف: دارزدن، ریسمان آویختن. خفه کردن.

ع: خَنَق، شَنق، صَلب.

وێنە←دار

**پەتی**

ك: رووت، سادە.[ناتێکەڵاو، ساکار]

ف: ژاو، ویژ، سارا، ناب.

ع: خـالِص، زُلال، مُطلَـق، بَحـت، مَحـض، صِـرف، مُجَرَّد.

**پەتی**

ك: رووت. (پای پەتی)[خاوس، خواس، بێداپۆشەرز]

ف: لخت، برهنه.

ع: عاري، عُريان.

**پەتیارە**

---

[1] - لە دەستنووسەکەدا وا نووسراوە، بۆم راستنەکرایەوە.(ر ـ ر)

ك: دێــو، بــەدجەنــەب، بەدســەکوت، ناشــیرین.[نــاجوان (ناقۆلا)]

ف: پَتیــاره، بَتیــاره، نازیبــا، دیــو، بدشــیوه، پَرغونه. (بد شکل)

ع: کَرِیَـه، بَـشِع، شـائِه (سَوءاء)، مُهِیـب، اَبوالْهَـول، غُول.

**پەچە**

[ك: جێگەخەوی مەڕ و مالاّت.]

ف: آغل، اَنگژوا.

ع: رَبَض، مَربِض.

**پەچەخوز**

ك: پەچــەخوس.[(خەوانــدنی مێگــەل لــە کێلگــەدا بــۆ بەپیتکردنی.)]

ف: اَنگژوا. (خوابانیـدن گلـه در زمـین زراعتـی برای رشوەی زمین.)

ع: رَبَض.

**پەچەخوس←پەچەخوز**

**پەچەك**

[(ك: پەنیر پەچەك: جۆرە پەنیرێکە.)]

ف: پَچِک، پَرچِک. (پنیر پچک: نـوعی از پنیـر است.)

ع: اُرنَة.

**پەحا!**

[ك: پەككوو! (وشەی سەرسوڕمانە.)]

ف: پَها!، پَه! (کلمەی تعجب است.)

ع: بَرحَی!، اَلعَجَب!

**پەخ**

ك: پان، داشکیاگ.[داشـکاو: هەرشـتێك کـە لێوارەکـەی ساف کرابێت و تیژیەکەی لابرابێت. هەروەها: تەنیشت]

ف: پَخ، پَهن، شکسته. پهلو.

ع: مُنكَسِر. ضِلع.

**پەخش**

ك: بلاّو، پەرێشان.[پەرش، پژاو. راخراو]

ف: پَخـــش، پَخـــج، ولاو، پریـــشان، پراگنـــده، شَهلیده، شَهریده، پَهن.

ع: نَشـر، نَـشر. مَنثـور، مَنـشور، مُنتَثِـر، مُنتَـشِر، شَتّي، شَتیت، مُتَفَرِّق. مَبسوط.

**پەخشە**

ك: تۆفانە، مێشوولە.[پێشکە]

ف: پشه، نارده، سارخَک، سارشَک.

ع: بَق، بَرغَش، خَموش، بَعوض، نَامُوس، فُسافِس.

**پەخمە**

ك: پۆخڵ، بۆلە، سەپۆل، فل.[گەلۆر، کەودەن]

ف: پَخمه، چل، پَپَه، لَش.

ع: دَنع، بَلید، مُهمَل.

**پەڕ**

ك: پەل.[تووکی باڵندە.]

ف: پر.

ع: رِیش.

**وێنە←بێخ پەڕ**

**پەڕ**

ك: قەراخ، سەر. (ئەوپەڕ، پەڕانپەڕ)[جەمسەر، لێوار]

ف: پَر، وَر، کَنار، کران، پایان، سَر، سون، سومه. (آن ور، آن سر)

ع: نِهایَة، مُنتَهَي، طَرَف، حَدّ، تُخم. (اَلطَّرَفُ الْآخَر)

**پەراسوو**

ك: دەنك، پەڕەکە، کەلەکە.[پەراسی. تەنیشت]

ف: دَند، دَنده، پَرّه. پَهلو، استخوان پهلو.

ع: ظِلع. (ضُلوع، اَضلاع، جَوانَح)

**وێنە**

**پەراشپەراش**

ك: وردوخان، داغان.[وردوخاش، هەلاهەلا]

ف: پَراشپَراش، ریزریز، پراگنده، داغان.

ع: مُتَكَسِّر، مُتَجَزِّي، مُتَفَرِّق.

**پەراش‌کردن**

ك: ووردوخان‌کردن، وورد کردن.[لەتوپەت کردن، ووردوخاش کردن]

ف: پراشیدن، پراگنده‌کردن.

ع: تَشتيت، تَكسير، تَجزِيَة، تَفريق.

**پەرانبەر**

ك: دەوراندەور، سەرانسەر.[سەرتاسەر، هەموو]

ف: سرتاسر. گرداگرد، زهازه.

ع: حَوالِي، اَطراف. مِن الرأس اِلى الرّاس، مِنَ الْبَدوِ اَلى الخَتم.

**پەڕاننن**

ك: كێشانن، سەرخستن.[لێنان، پەڕاندن (سوار کردنی نێر لە مێ.)]

ف: پراندن، گشنی، ایغری‌دادن. (انداختن نر بر سر ماده.)

ع: اِسفاد، اِنزاء، فَحل.

**پەڕانن**

ك: فڕانن، باڵدان.[هەڵفڕاندن]

ف: پَراندن، پَروازدادن.

ع: اِطارَة، تَطيير.

**پەراوێز**

ك: سجاف.[کەنار، حاشیە]

ف: پَراویز، پَرویز، پَریز، پَروَز، فَراویز، فَرویز، فَریز، پَروَر، بَروَر، سجاف، سنجاف، وژنگ.

ع: عَطف، كُفَّه، حاشِيَة، سِجاف.

**پەرپووت←فەرفووت**

**پەرت**

ك: بڕنگ، فڕە، تووڕ، سووڕ، وزاق، هەوا، حەوا. (پەرت دان) [فڕێ: بەشی یەکەمی وشەی «فڕێدان».]

ف: پَرت، پرتاب، انداختن.

ع: قَذف، رَمي، طَرح، نَبذ.

**پەرت**

ك: پەرش، بڵاو. (پەرت و بڵاو) [پەرێشان، پرژوبڵاو]

ف: پَرت، پَراش، پَراگنده.

ع: شَتيت، مُتَشَتِّت، مُتَفَرِّق، مُتَشَعِّب.

**پەرت**

ك: وێڵ، غەڵەت، نادرووس. (وێڵ قسەکردن)[بێ‌مانا، هەڵە]

ف: پرت، ناپیوسته، نادرست، ناروا.

ع: غَير مَربوط، غَلَط، خَطَأ.

**پەرت‌بەستن**

ك: قەوانچەبوون، حەوانچەبوون.[هەڵدێران]

ف: پَرت شدن.

ع: سُقوط.

**پەرت دان**

ك: تووڕدان، هەوادان، فڕەدان، پەرتدان.[هاویشتن]

ف: پرت دادن، پرتاب کردن.

ع: قَذف، رَمي، طَرح، نَبذ، رَفض.

**پەرت‌سێنی**

ك: وێڵخڕی.[ك: کڕین بۆ خەڵکی بەبێ ڕەزامەندیان.]

ف: مَشته، پَرت‌خَری.

ع: بَيع فُضُولِيّ.

**پەرت‌کردن**

ك: پەرتدان، تووڕدان، حەوادان، فڕەدان، بڕكدان. [هاویشتن]

ف: پرت کردن، دورانداختن، پرت دادن، پرتاب کردن.

ع: قَذف، رَمي، طَرح، نَبذ، رَفض. وَحش، تَوحيش.

**پەرتگا**

ك: تووش، لێژایی، خزگە، هەڵەت.[هەڵدێرگە]

ف: پرتگاه، لیزگاه، خیزگاه.

ع: زَلَق، زَلَج، زَلَل، زُلّ، مَزلَقَة، مَقذَفَة، قَذف، وَعر، مَزلَجَة، مَزلَخَة.

**پەرتوپەلا**

ك: هەڵیتوپەڵیت، کەڵپەتره، شرووِر.[تێکەڵوپێکەڵ]

ف: پرت‌وپلا، کلپتره، لکلکه، بیدلا، قلماش، یاوه، پراکنده.

ع: شَــذَر، مَــذَر، شَـطَحات، شَـماریج، اَباطیــل، خُرافات، هَذَیان، لُوی، مُخلَط، مُتَفَرِّق.

**پەرتویژی**

ك: وێلوێژی.[قسەی نارێك و نەگونجاو کردن.]

ف: پرت‌گویی.

ع: فُضُولِيّ.

**پەرجو**

[ك: موّجزات، دەرناسا]

ف: فَرجود.

ف: مُعجِزه، کَرامَة.

**پەرچ**

ك: پەرچین.[پەرژین (دیواری دڕکوداڵ بە دەوری باخ و شتی لەو چەشنەدا.)]

ف: پرچین، بَرهــون، فَلغَنــد، تــواره، خاربَــست. (حصاری‌که از خــار و خلاشــه در اطــراف بــاغ مثلاً می‌سازند.)

ع: وَشِیع، سِیاج، تَشویك، خَزّ.

**پەرچ**

ك: خەفانن، خەفیان.[خوارکردنــەوه، خەوانــدن. نوشــتانەوه (وەك: خەواندنی نووکی بزماری تاسنین.)]

ف: پــرچ، پــرچین، خوابانــدن. (خوابانــدن نُــك میخ آهنی مثلاً.)

ع: عَطف، تَثنِیَة.

**پەرچ**

ك: بەرپەرچ، بیانك.[بیانوو. هوّ. بەربەست]

ف: بَهانه. انگیزه. مُس.

ع: عُذر. عِلّة. مانع.

**پەرچانن**

ك: پەرچ‌دانەوه، خــەفانــن.[خوارکردنــەوه، خەوانــدن (وەك: پەرچ دانەوەی سەری بزمار.)]

ف: پَرچاندن، پَــرچین کــردن. (خوابانــدن ســر میخ مثلاً.)

ع: عَطف، تَثنِیَة.

**پەرچ‌دانەوە**

ك: بەرپــەرچ‌دانــەوه، دورســـەوکردن.[راســت‌کردنـــەوه، راڤەکردن، لێکدانەوه]

ف: سَفرَنگ، درست کردن.

ع: تَأویل.

**پەرچ‌دانەوە←پەرچانن**

**پەرچین**

ك: پەرچ.[پەرژین]

ف: پَرچین، بَرهون، تواره، فَلغَند، خاربَست.

ع: وَشِیع، سِیاج، خَزّ، تَشویك.

**پەرچین کردن**

ك: پەرچ‌کردن.[پەرژین کردن]

ف: پرچین کردن، بَرهون کــردن، تُــواره کــردن، خاربست کردن، فَلغَند کردن.

ع: تَرجیب، تَوشیع، تَسییج، تَشویك، خَزّ.

**پەرخاش**

ك: تالّوّزی، جەنگ.[دەمەقاڵە، شەڕ]

ف: پَرخاش، فَرخاش، ناوَرد، تُندی، جَنگ.

ع: نِزاع، جِدال، اِحتِداد، تَغَیُّر، وَغا.

**پەرد**

ك: فەرد، تەوەق.[رووپەڕ، لاپەڕه (وەك: تەوەقی کاغەز.)]

ف: پرد، فرد. (کاغذ مثلاً.)

ع: وَرَق. (طَبَق)

**پەرد**

ك: تا، تاك.[تاق]

ف: تَک، تاک، لنگه، تا، یک.

ع: فَرد، وَحید.

**پەرداخ**

[ك: سافولووس]

ف: پَرداخ، پَرداغ، زدایش.

ع: صِقل، صِقال، سَقل، سِقال،جَلی، جَلا، جَلاء، شَوف.

**پەرداخ**

[ك: لووسكەر، سافكەر]

ف: پرداخ، پرداغ، بزداغ، زداینده، پرداز، پرداس.

ع: مِصقَل، مِسقَل، مِصقَلَة، مِسقَلَة، صَیقَل، سَیقَل، سَیقَل، جِلاء.

**پەرداخ كردن**

ك: پاكەوكردن، ژەنگ لابردن.[شەوقدار كردن، لووس كردن]

ف: پرداخ كردن، پرداغ‌دادن، پرداختن، زدودن، زداییدن.

ع: صَقل، سَقل، صِقال، سِقال، جَلي، جَلاء، تَملیس، تَجلیَة.

**پەردژ**

ك: وچان، دەسرەس، دەسپەرژ.[هەل، دەرفەت]

ف: رُستی، دست‌رَس.

ع: فُرصَة، مَجال، فراغَة.

**پەردە**

[ك: قوماشی داپۆشەری دەرگاو پەنجەرە.]

ف: پَردە، باشام، پَرس، تُتُق، سار، سادە، پوش، پوشە.

ع: سِتر، سِتار، سِدن، سُدل، خِدر، حِجاب، حائِل، سُرادِق.

**پەردە**

[ك: داپۆشەر]

ف: پردە، پوشە، پوشش.

ع: غِشاء، غِطاء.

**پەردە**

ك: تۆ، تۆك، پەرە.[لاپەرە، رووپەر، توێ]

ف: پردە، پرَه، توی، تاە، لای.

ع: وَرَق، صَفحَة.

**پەردەدڕی**

[ك: رازهەڵماڵین (ئاشكرا كردنی راز.)]

ف: زیمور، پردەدری. (گفتن پوشیدە)

ع: هَتّ، هَتر، هَتك، مَزق، تَمزیق.

**پەردەی بەیاخ**

ك: بەیاخ، باڵ بەیاخ.[پارچەی ئاڵا]

ف: منجوق، دستارچە، دستمال.

ع: كُلثوم، عَلَم، ثَوبُ البَیرَق.

وێنە←بەیاخ

**پەردەی دەروازە**

ك: سەراپەردە.[پەردەیەكی گەورەیە بە دەروازەدا یا دیوانی میردا هەڵدەواسرێت.]

ف: دَرسار، دَرسارە، سَراپَردە.

ع: سُرادِق، رِواق، فُسطاط.

**پەردەی زك**

[ك: پێستی ناوەوەی سك.]

ف: پردەی شكم.

ع: صِفاق.

**پەردەی ژێر پۆس**

[ك: پێستی ناوەوە. (پێستی ناوەوەی مرۆڤ یا ئاژەڵ.)]

ف: پردەی زیر پوست. (پوست بدن انسان یا حیوان)

ع: صِفاق.

**پەردەی ساز**

[ك: مەقام: هەركام لە ئاوازەكانی مۆسیقا.]

ف: باشام، پردەی ساز.

ع: مَقام.

**پەردەی کەت**

[(ك: ئەو پەردەیەی بە دەوری قەرەوێڵەدا دەیکێشن.)]

ف: تختسار، پردەی تخت. (پردەای کە دور تختخواب کشند.)

ع: دَخدار.

**پەردەی لووت**

[ك: پەرەی لووت (پەردەی نێوان هەردوو کونەلووت.)]

ف: پردەی بینی. (پردەی بین دو سوراخ بینی.)

ع: وَتیرَة، وَتَرَةُ الْأنف.

**پەردەی منالْ**

[ك: وێلاش، پەرەوڵ]

ف: پردەی بچە.

ع: سَلا، سَلَی، غِرس، مَاسِکَة، مَشیمَة.

**پەردەی وەوی**

[ك: پەردوو: پەردەی بووك و زاوا.]

ف: سرشکوان، سرشکوَن، پردەی دامادی.

ع: کِلَّة، حَجَلَة، مَنصَّة.

**پەردەیی**

[ك: پەردەنشین، شاراوە]

ف: پردگی، پردەنشین، درپردە، نهان، پَنهان، پوشیدە.

ع: مَستور، مَکتوم. مَستورة، مُخدَّرَة، مَحجوبَة.

**پەرژیان**

ك: پەردژیان. دەس‌گەیین، دەسرەس، دەسپەرژ. [پەرژانەسەر، پێوەخەریکبوون. هەل، دەرفەت]

ف: رُستیدن، دَسترَسیدن. رُستی، دَسترَس.

ع: تَفَرُّص، اِفتِراص، فُرُوغ، فَراغ، تَفَرُّغ. فُرصَة، فَراغَة، مَجال.

**پەرَس**

[ك: پەرست (بە مانای «پەرستەر») بەلاّم هەمیشە لەگەڵ وشەی تردا بە کار دەهێنرێت: خواپەرَس.)]

ف: پَرست. (بمعنی پرستندە است، منتها همیشه با اضافه استعمال می‌شود: خداپرست.)

ع: عابِد. (عابِدُ الله)

**پەرَسسار**

ك: بیمارپەرَس.[سستەر، نەخۆشکار: چاودێری نەخۆش. (ئەگەر ئافرەت بێت لە فارسیدا «پرستە»ی پێ دەڵێن نەك «پرستار».)]

ف: پرستار، زوار، زاوَر، بیمارپرست. (اگر زن باشد در فارسی پرستە می‌گویند نە پرستار.)

ع: مُدوِي، مُداوي.

**پەرَسسار**

ك: سەرپەرَس، فرمانکەر، خزمەتکار، نۆکەر، بەخوێدار. [کارەکەر، خولاّم. خێوکەر]

ف: زوار، زاوَر، روزدار، روجدار، بُد، فرمانبَر.

ع: خادِم، مُستَخدِم. حاضِن، مُتَوَلِّي.

**پەرَسساری**

ك: بیمارپەرَسی.[نەخۆشکاری]

ف: پرستاری، زاوَری، زواری، بیمارداری، بیمارپرستی.

ع:اِدواء.

**پەرَسساری**

ك: سەرپەرسی، نۆکەری، فرمان‌کردن، خزمەتکاری، خوێداری. ناوهاوردن. [بەخێو کردن. کار بۆ کردن]

ف: زواری، زاوَری، روزداری، روجداری، فرمانبرداری.

ع: خِدمَة، حَضانَة.

**پەرَسسە ← مەعبوود**

**پەرَسسین**

[ك: پەرستن، بەندایەتی کردن]

ف: پرستش، پرستیدن، پرستش کردن.

ع: عِبادَة.

**پەڕ سۆنە**

[(ك: پەڕی کلکی مراوی کە سەرەکەی چەماوەتەوە.)]

ف: کژک، کجک. (پر دُم مرغابی کە سر آن کج است.)

ع: رِیشَةُ البَطّ.

وێنە←سۆنە ‹٢›

**پەڕ سیاوەخش**

ك: پەڕ سیاوەش.[گیایەکە.]

ف: پَر سیاوُش، پَر سیاوشان.

ع: وَصیف، شَعرُ الْاَرض، شَعر الْجِنّ، لِحیَةُ الْحِمار.

**پەرش**

ك: بلاو، پرژ، پژیاگ.[پژوبلاو، پژاو]

ف: پَراش، پَخش، پَخج، ولاو، پراگنده، شهریده.

ع: شَتیت، شِتات، مُتَفَرّق، مُتَلاشي.

**پەڕش**

ك: پەڕین، پەرواز.[فڕین]

ف: پَرش، پَریدن، پَرواز، پرباز، پروازکردن.

ع: طَیَران.

**پەڕش←پەڕشت**

**پەڕشت**

ك: پەڕش، پەڕشە.[ دانەوێڵەیەکە.]

ف: پَرنج، جَوگَندم، جوبرهنە، برهنەجو.

ع: دَشیش، سُلت، خَرطَل، خُرطال، بُهمی، قُرطمان، هُرطمان.[1]

وێنە

**پەڕشە←پەڕشت**

**پەڕشێن**

[ك: چێشتی پەڕشە.]

ف: آش پَرَنج.

ع: دَشیشة، شیشە.

**پەڕکێشیاگ**

[ك: باڵکراو (باڵندەی تووك هەڵکێشراو.)]

ف: باولی. (پرندەی بال کندە شدە)

ع: مَنزوعُ، مَقلوع الریش.

**پەرگ**

ك: دەزگ، بەن.[دەزوو (بەنی گیوە.)]

ف: نَخ. (نخ گیوە)

ع: خَیط، سِلك.

**پەرگار**

[ك: پرگاڵ: ئامرازێکە لە «ئەندازە»دا.]

ف: پَرگار، پَرگال، پَردال، بَردال.

ع: دَوّارَە، فَرجار، بَرکار، بِرکار، بیکار.

وێنە

**پەڕگەردەن**

ك: پەڕ مل.[تووکی مل (پەڕی گەردنی باڵندە.)]

ف: پرگردن. (پر گردن مرغ)

ع: بُرائِل.

**پەرکەما**

[ك: پەرکەما: تەختی کەنارەی کڵاش(کە جێگەی بەستنی بەنگەلی کڵاشە.)]

ف: نَخبند. (نخبند گیوە.)

ع: مَخیط، مَربَط.

**پەڕ مل←پەڕگەردەن**

**پەرمیان**

ك: باوڕ، همێ.[پەرموونەوە. ئومێد]

ف: باوَر، دلگرمی. امید، چشمداشت.

ع: اِطمینان، اِعتِماد. اِنتِظار، تَوَقُّع.

**پەرنّنە**

---

١ - ئەم دوو وشەیە لە دەستنووسەکەدا خەتێکی بەسەردا کێشراوە، لەوانەیە نووسەری بەڕێز سڕیبێتیەوە. (ر - ر)

ك: مر، پەلەوەر، مەل.[باڵندە]
ف: پرندە، مُرغ.
ع: طَیر، طائِر.
**پەڕنیان**
[(ك: جۆرە پارچەیەکی ئاوریشمینی نەرم و ناسکە.)]
ف: پرنیان، پرنا، پرنون، پرند. (دیبایی است لطیف و نازک.)
ع: دیباج، فَرنیا.
**پەڕۆ**
ك: شڕە، پەڕۆکوتە.[پارچە قوماشی کۆن.]
ف: رَکو، رگو، رگوی، رگوە، رگوک، لَتّە، کُهنە.
ع: خِرقَة، مِبذَلَة، معوز، رِفاة، عِصابَة.
**پەروا**
ك: باك، کیمحوا، بیم، ترس.[سام، خۆف]
ف: پَروا، باک، بیم، تَرس، هَراس، پَرواس.
ع: خَوف، جُبن، وَجَل، رُهب، نَخب، هَلَع، اِعتِناء، مُبالاة.
**پەروار**
ك: دابەسیاگ.[دابەستە (ئاژەڵی دابەسراو بۆ قەڵەوبوون.)]
ف: پَروار، پَرواری، پرورده. (حیوان بسته شده که فربه شود.)
ع: مُزَیَّر، مُسَمَّن، اَکولَه.
**پەرواز**
ك: پەڕین، پەڕش، باڵەوگرتن.[فڕین]
ف: پَرواز، پَرباز، پَرش، پریدن، پَرواز کردن.
ع: طَیَران.
**پەروازە**
[ك: باڵـەفڕە (بێـچووی باڵـندە کـە تـازە فێـرە هـەڵفڕین دەبێت.)]
ف: پَروازە (بچەی پرندە کە تازە پرواز کند.)
ع: نَاهِض.
**پەروازە بوون**
[ك: باڵەفڕە بوون(ی بێچووی باڵندە.)]
ف: پروازە شدن. (بچەی طیور.)
ع: نُهوض.
**پەروانە**
[ك: پەپوولە]
ف: پَروانە.
ع: بَشَارَة، رَعَاشَة، فَراشَة، فُرفور.
وێنە
**پەرۆش←پەرێشان، پەژارە**
**پەڕۆکردن**
ك: پینەکردن.[پارچەدوورین بەسەر دڕاودا.]
ف: پینە کردن.
ع: اصلاح، تَصلیح، تَرقیع.
**پەڕۆکردن**
ك: پینەکردن.[ساخ کردنەوە، دوورینەوە. لێکدانەوە]
ف: پینە کردن، رفو کردن.
ع: تَأویل، تَلفیق، تَرمیم.
**پەڕۆ کۆنە**
ك: پەڕۆ، شڕە، کوتە.[لەتە قوماشی کۆنبوو.]
ف: کُهنە، رَکو، رگو، رگوک، رگوە، هود، لَتّە.
ع: خِرقَة، مِعوَز، مِبذَلَة، رِفادَة، عِصابَة، رَثِیث، رَثّ. (شَرطوطَة)
**پەروەردگار**
ك: خوا، خودا.[خودێ، یەزدان]
ف: پروردگار، آفریدگار.
ع: رَبّ، اِله.
**پەروەردە**
ك: بەنازهاورِیاگ.[بەخێوکراو، بارهێنراو]
ف: پَروَردە، فَروَردە، پرورش‌شدە.
ع: مُرَبّی. رَضیع.
**پەروەردەبوون**
ك: بەنازهاورِیان.[بەخێوکران، بارهێنران]

ف: پَروَرده شدن، پَروَرش یافتن، فَروَرده شدن.

ع: رَبو، تَربّي.

**پەروەردەکردن**

ك: بەناوهاوردن.[بارهێنان، بەخێوکردن]

ف: پَروَردن، فَروَردن، پَروَرش دادن.

ع: تَربیب، تَربِیَة، حَضانَة.

**پەڕۆی بۆسۆ**

[ك: پەڕۆی تازە سووتاو بۆ گیرسانەوەی خوێنی برین.]

ف: هود، لته. لته سوخته.

ع: حُراقه.

**پەڕۆی بێنوێژی**

[ك: پەڕۆی حەیز]

ف: شَلّه، شَنگه.

ع: حَیضَة، مَحیضَة، رِبذَة، مِعبَئَة.

**پەڕۆی درگای شیشە**

ك: سەربەس.[سەرقاپ]

ف: لتەی شیشه. (کهنەی در شیشه.)

ع: عِفاص، غُلَّة.

**پەڕۆی دەور زەخم**

ك: پەڕۆی زەخم، زەخمپێچ. دەسهەڵبەس.[پێچار، برینپێچ]

ف: مُریشَم، خَستەبَند، لَتەزخم.

ع: سَبِیبَة، عِصابَة، لِفافَة، طَرِیدَة، ضِماد، دِسام.

وێنە

**پەرویز**

[(ك: ناوە بۆ پیاوان و بەمانای «سەرکەوتوو»یشە.)]

ف: پَرویز، اَپَرویز. (اسم مرد است، بەمعنی منصور هم هست.)

ع: فَرویز. مَنصُور، مُظَفَّر.

**پەڕە**

ك: پەرد، فەرد، پەلە.[ڕوویەڕ، لاپەڕە، توێ]

ف: پره، پرد، فرد، تا، لا، رو.

ع: وَرَق، صَفحَة، صَحیفَة.

**پەڕە**

ك: پەڕەکە. [دیانە، ددانە. هەرشتێکی پەڕناسا. (وەك: پەڕەی ئاش.)]

ف: پره، دنده. (پرەی آسیا.)

ع: ضِرس، جانِحَة.

**پەرە**

ك: پەلە، داینە. (پەرەی بیاوان)[داوێنە]

ف: پَرَه، دامَنه، راغ.

ع: سَفح، حَضیض، فَلاة.

**پەڕەپا**

[ك: پەڕلەپێ (کوترێك کە «پێ»ی پەڕدار بێت.)]

ف: پرپا، پرپای. (کبوتری که پای آن پرداشته باشد.)

ع: مُسَرول، مُسَروَلَة.

**پەڕەپەڕە**

ك: توێتوێ.[توێتوێ]

ف: پَرەپَره، توبَرتو، لابَرلا.

ع: مُوَرَّق، مُصَفَّح.

**پەڕە کا**

[ك: لاسکی وشکی دەغڵ. (گەڵای کا)]

ف: پرەکاه، پرکاه. (برگ کاه)

ع: تِبنَة.

**پەڕەکە**

ك: پەڕە.[دیانە، ددانە. هەرشتێکی پەڕناسا.]

ف: پره، دنده.

ع: ضِرس، جانِحَة.

**پەڕەکە**

ك: پەراسوو.[پەراسی (ئێسقانی کەلەکە.)]

ف: پره، دنده. (استخوان پهلو)

ع: ضِلع. (اَضلاع، جوانح)

وێنە←پەراسوو

**پەڕەکەی ئاسیاو**

[ك: پەرەگەلی تۆپی ئاش.]

ف: پرەی آسیا.

ع: اَضراس الرَّحَی، جَوانِح الرَّحَی.

**پەرەکەی قوڵف**

[ك: زمانەگەلی قفل.]

ف: پرەی قفل.

ع: اَضراسُ القُفل.

**پەرەکەی کوڵوم**

[(ك: زمانەی تقلی دارین.)]

ف: کوژنوک، کوژانوک. (پرەی کلیدان)

ع: لِسانُ الغَلَق.

**پەرەکەی ماسی**

[ك: باڵەماسی]

ف: پرەی ماهی.

ع: زَعنفَة، جَوانِحُ الحوت.

**پەرەی بیاوان**

ك: پەلەی بیاوان.[داوێنی دەشت]

ف: پرّەی بیابان، دامنەی بیابان.

ع: سَفح، ذَیلُ الفَلاة، جَنح الفَلاة.

**پەرەی لووت**

ك: بەلگ لـووت، نەرمـەی لـووت.[(پـەردەی ناوەڕاسـتی لووت.)]

ف: بَجَس، پرەی بینی، پر بینی، نرمـەی بینـی، بلگ بینی. (پردەی وسطی)

ع: مارِن.

وێنە← پەرۆی دەور زەخم ‹٢›

**پەری**

ك: فریشتە.[مەلایکە]

ف: پَری، پَرشتە، پَرهشتە، فَرشتە.

ع: مَلَك.

**پەرێ**

ك: پێرەکە، پێر. [دوو ڕۆژ پێش. (وشەیەکی گۆرانیە.)]

ف: پَری. (گورانی است.)

ع: قَبلَ الأمسِ.

**پەرێ**

ك: بـۆ. (پـەرێو ئەحمـەدی)[لەبـەر خـاتری (وشـەیەکی گۆرانیە.)]

ف: برای. (گورانی است.)

ع: لِ، لِاَجلِ.

**پەریبڕ**

[ك: منداڵێك کە خەتەنە کردنـی ناوێـت. (خەتەنـەکراوی خواکرد.)]

ف: بی‌خُروسَک. (مادرزاد)

ع: مَختون. (خَلقاً، فِطرَتاً)

**پەریجان**

[(ك: ناوە بۆ ژنان.)]

ف: اسم زن است.

**پەریز**

[ك: گیاوشتر: ڕوەکێکە.]

ف: پَریز، فَریز.

ع: اَذخَر.

**پەرێش**

ك: پەشێو، پەرێشان.[بیربڵاو، خەفەتبار]

ف: پـَــریش، پَریـــشان، پَریـــشَن، آشـــفتە، اَندوهگین.

ع: مَلول، مُشَوَّش، مَهموم، مُکَدَّر.

**پەرێشان**

ك: پەرێش، پەشێو.[بیربڵاو، خەفەتبار]

ف: پَریشان، پَریش، پَریشَن، آشَفتە، آشـوفتە، شکولیدە، کُشُفتە، کَراشیدە، اَفسردە.

ع: مَلول، مُشَوَّش، مَهموم، مَحزون.

**پەرێشان**

ك: پراش.[لەتوپەت، پرژوبڵاو]

